# شتێ لە بارەی ئەقڵەوە



عەبدولکەریم سروش

و: ئاگری ئەفشین

ئەقڵ و وەحی

ئەقڵ و ئەوین

ئەقڵ و شۆڕش



2019

دەگێڕنەوە کە“ریچارد رورتی” گوتویەتی لە سەردەمانی چەرخی ناویین خودا، خودا بوو. دواتر لە سەردەمی رۆشنگەری و مۆدێرنیتە خودا، ئەقڵ بوو و ئەورۆکەش واتە لە سەردەمی پۆستمۆدێرنیتە، خودا بوونی نییە. ئەم قسەیە سەرێکی لە راستی داوە. بتی ئەقڵ یاخود خودای ئەقڵ ئەمڕۆ شکاوە و نێوی لە نێو نێوان نەماوە، ئەو وشەیەی رۆژگارێک لە پیرۆزترینەکان بوو و جێگای شانازی و لە بەرزترینەکان بوو، بەڵام ئەمرۆ سەرکز و بێدەنگە و جێگای گومان و دڕدونگە. ئەقڵی ئەرەستۆیی، ئەقڵی دیکاریتی، ئەقڵی کانتی، ئەقڵی هیگڵی، ئەقڵی دینی، ئەقڵی مێژوویی، ئەقڵی دیالیکتیکی، ئەقڵی هزری، ئەقڵی کردەیی... خولاسە بە وردودرشت و ڕەش وبۆرییەوە، ئاوێنەی ئەقڵ بەجۆرێک وردوخاش بووە کە ئیتر روخسارێکی کامڵی تیا نابینرێ.

ئەمڕۆ کاتێک لەبارەی ئەقڵەوە قسان دەکەین، مەبەست لە جۆرەکانی لۆژیکی بەرانبەرکێ کردن و توێژینەوە و سەلماندن و ڕەتکردنەوەیە، یاخود مەبەست لە بەرهەمە هزرییەکانە لەوانە فەلسەفە، زوان، ئاکار و زانستە. لەبەرئەوەی ئەم بەرهەمانەش هەموویان ڕەوان و گۆڕاون، بۆیە گۆڕان و پەرەسەندنی ئەقڵ بەشێکە لە بابەتە بەڵگەنەویستەکانی ئەم ڕۆژگارە. ئەقڵی کۆن و ئەقڵی نوێ لێکتر جیاوازن، چونکو بەرهەمەکانی ئەم ئەقڵە، واتە زانست، فەلسەفە، ئاکار، سیاست و ئابوورییان لێکتر جیاوازە. لەبەرئەم وێکنەچوونەیان چارێک نییە جگە لەوەی دەستەودامێنی ڕێژەییخوازی(نسبیگەرایی) ببین کە ئەوەش هەمان ئەو شتەیە کە ئەمڕۆکە هەموومان تێیدا نقم بووینە.

بەشێک لە فەیلەسووفانی موسڵمانان، وایان حەساو دەکرد کە ئەقڵی هزری لە بەڵگەنەویستەکانی هزرە و ئەقڵی کردەییش لە بەڵگەنەویستەکانی کردەییە. بە پێی ئەم بۆچوونە، ئەوێ بێژین کە بەڵگەنەویستیشەکانیش گۆڕدراون، ئەوەی لە بۆ پێشینان بەڵگەنەویست بووە ئەمڕۆ لەم پلە و پایەیەی خۆی کەوتووە و پێچەوانە بووەتەوە. لە چەرخی ناوین بوونی خودا لە بەڵگەنەویستەکانی هزریی بوو، بەڵان ئەمرۆکە ئەم پلەیەی لە دەستداوە، لە بری ئەوە "مافی مرۆ" بۆتە بەڵگەنەویستی ڕۆژگار. ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەم شتە لە ئەقڵی بەڵگەنەویتسی کردەیی پێشینان هیچ ئاسار و نیشانەیەکی لێ بەدی ناکرێ. سەردەمی رۆشنگەری، خۆی رۆشن دەدی و چەرخی ناوینیشی بە تاریکی ناودەبرد، هەڵبەت ئەگەر لە چەرخی ناوینییەکانت پرسیبا، ئەوا شوێنی ئەم دوو هاوەڵناوەیان ئاڵوگۆڕکێ پێدەکرد و رۆشناییان بۆ خۆیان پەسەند دەکرد و تاریکیش بۆ رکابەرانی. دەرکەوتووە کە هەم سەردەمی رۆشنگەری و هەم چەرخی ناوینیش دیوارێکیان بە دەوری خۆیاندا هەڵچنی بوو و ناوی سەرمەشق(پارادایم)یان لێ نابوو یاخود هەمان (بەڵگەنەویستی) کە دانیشتوان و شوێنکەوتوانی ئەم دووە بە زەحمەت لە ئاستێکی بەرزتر دەیانتوانی، دەست بکەنە رەخنەگرتن لە خۆیان. تەنیا ئەو کاتە چاو و گوێ و زمانیان کراوەتەوە کە ئەم دیوارانەیان ڕوخاندووە، کە سەردەمی ئێمەش واتە ئەم پۆست مۆدێرنیتەیە لێکچونێکی لەو جۆرەی هەیە.

هەمووان ئەو خاڵە لە "کویهن" و "فۆکۆوە" فێربوونە کە ئێمە تەنیا یەک عەقڵانییەتمان نییە بەلکو چەندین عەقڵانییەتمان هەیە، ئەگەر بمان هەوی وانەیەکی حساویی لێوە فیرببین بریتییە لە "خۆبەزلنەزانینی عەقڵانی". پێشینیان دەیانگوت فیز و لەخۆبایی

بوون پەردەیە بە ڕووی دەکارکردنی ئاوەز، بەڵام ویستا دەبێ بگوترێ فیز، خودی بێ ئاوەزییە. خاکی بوون لە ئاکارە جوانەکانی زانست دۆستان و دانایانە.

لە یاسا گشتی و جیهانییەکانرا بگرە کە ڕۆژگارێک بە ئەقڵی کامڵ حەساو دەکرا و بۆ هەموو مرۆڤەکانیان بەراست دەزانی، بەڵام ئەمڕۆ لە ئاڵۆزترین کێشەکانە، تاکو ئەمڕۆکە لە ڕۆژگاری فرە ئایینی (پلۆرالیزم) و ڕێژەییخوازی کە بەرهەمەکەی خاکی بوون و دژە دوگماتیزمە، بەڵام ئەقڵ نەک هەر تەنیا لە ناوەوەی خۆی ڕووبەرووی زۆرێک لەو شتانە بۆتەوە کە بونەتە هۆی لەبەریەک هەڵوەشانی ئاوەز، بەڵکو لە دەرەوەشرا کێبرکێکاری زۆری هەبووە و هەیە. من لێرەدا ئاماژە بە سێ دانە لەو ڕکابەرانە دەکەم کە خۆم لە گەڵیان ژیاوم و ئەزموونم کردوون:

## ئەقڵ و وەحی

"بەندیکت" پاپای شانزهەم، لەم ئەخیرانە وتارێکی دا کە قواقوی لێکەوتەوە، بە پێنازینەوە باسی لە ڕەفێقایەتی و هاوکاری نێوان فەلەو فەلسەفەی یۆنانی کرد، ئاشتەوایی نێوان ئەم دوانەی بەفەڕ و بەپێز ناوبرد و ئیسلام و پرۆتستانتیزمی بە ناحەز و دزێو لە قەڵەم دا، لەوەی کە ئەمانە نەیانتوانیوە لە تەک ئەقڵ، ئەویش ئەقڵی فەلسەفی و یۆنانی وەڵفەتیان هەبێ و بە خویایی خودای ئیسلامی بە دژە ئاوەز و دژە ژیریی زانی. لێرەدا جێگای داوەری کردن لەسەر ئەم قسە لە ڕوو پڕ و ناوبەتاڵە نییە، بەڵکو مەوزوعەکە ئەوەیە کە پێوەندی نێوان عەقڵ و وەحی هیچ کات پێوەندییەکی پیاوانەو سەت لە سەت دۆستانە نەبووە.

عەقڵ سەربەخۆیە لە رۆح، هەردەم بە رقەبەری رۆح حسێو دەکرێ و پێغەمبەرانیش هیچ کاتێ خۆشیان نەهاتووە بە فەیلەسووف بناسرێن. موتەکەلیمەکان کە بەڵگاندن و عەقڵاندنیان بۆ باوەڕە دینییەکان دەکرد و خۆیان بە خزمەتکاری ئایینەکەیان دەزانی، کەچی لە لای شوێن کەوتوانی ئۆرتۆدۆکس بە خاین حەساو دەکران. ئەمانە موتەهەم ئەکران بەوەی کە بە هۆی ئەقڵانی کردن، دین ئەکەنە پاشکۆی ئەقڵ و بە تەرازوی ئاوەز ڕاستی و دروستی دین ئەپێوین کە ئەمەش، جێگای گومان و بێ بەهرەییە. باوەڕداران دەیانگوت کە وەحی هاتووە تا دەستی عەقڵ بگرێ، چۆن ئەبێ ئەمە پێچەوانە ببێتەوە و ئێستا ئاوەز بێت دەستی وەحی بگرێ؟ هەندێکیش لەمە زیاتریان وتو و پێیان وابوو کە عەقڵ تەنیا بۆ چرای شەوانی بێ وەحی بەکەڵکە، هەرکاتێ خۆری وەحی سەری وەدەرنا ئەبێ ئەم چرایە خامۆش بکرێ. هەڵبەت جۆرێ لە هاوکاری نێوان ئەم دوانە پەیا بوو، ئەویش ئەوەی کە خوای داهێنەر واتە خولقێنەری ئەقڵ هەمان خوایە کە وەحی ڕەوانە کردووە کە ئەمەش خشتی بناغە بوو بۆ هەڵچنینی دیواری هاوکاری نێوانیان. زۆرێک لە فەیلەسووفانی گاور و موسڵمانان لەوانە "ئیبن سینا" و "فارابی" و "تۆماس ئاکویناس" لەم دۆڵەدا بوون. قوتابخانەی کەلامیی "موعتەزیلە" کە بەداخەوە لە بەرامبەر"ئەشعەری" شکانێکی مێژووی بەخۆیەوە بینی، لەسەر بنەمای رازی بوون بە "ئەقڵ و شەرع پێکەوە" بونیاد نرابوو و لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیش دەستەملانێ بوو. خودای ئەم قوتابخانەیە خودایەکی دادپەروەر و ئاکار پەسەند بوو، هاوکات کارەکانیشی بە کەیفی ئاوەز بوو. لەم قوتابخانەیە ئاوەز ئەوەندە چاخ بوو کە دین بە لەڕی دەردەکەوت. رێک بە پێچەوانەی ئەشعەری کە ئایینێکی قەڵەو و ئەقڵێکی لاوازی هەبوو. سۆفییەکان هەر لە بنەڕەتڕا

حەساوێکی تریان لەسەر ئەکرا، گەیشتبوونە ئەوینێکی بەرز و بەپێز کە ئەقڵ و دین لە لایەوە لاواز دەردەکەوت.

بەڵێ، دەستکەوتەکانی ئەقڵی ئەزموونی لە سەدەی شانزە و حەڤدەی ئەورووپا کێشەکێشی نووستووی چەندین ساڵەی نێوان زانست و کتێبی پیروزی وەخەبەر هێنا، کە بە بڕوای من ئەم مشتومڕانەی نێوان زانست و ئایین بە قازانجی هەرتک لایان بوو و فێریش بوون کە ئیتر ئیدیعای زلتر نەکەن و بێ فیز بن، هاوکات بەرامبەر دۆزینەوەکان و ئاڵۆزیی ڕاستیەکانیش زیاتر هەستیار بن. ئەم چەقە وهرایە پێشڕەویی کرد تاکو سەرهەڵدانی پڕۆتستانتیزم، شەڕ و کوشتاری خوێناوی نێوان تیرە جیاوازەکانی ئایینی گاور ڕێگەی بۆ سێکۆلاریزم کردەوە، ئەویش سەودای "بێ لایەنی حکومەت لە دین"ی لە سەردا بوو و باڵادەستی یەک دینی بەسەر ئەوانی دیکەدا خڕ کردەوە.

وەحیی ئیسلامی حەساوی جیا بوو. ئەگەرچی لەگەڵ عەقڵ بە تایبەتی عەقڵی یۆنانی ساتێک سازگار و ساتێک ناتەبا بوو، بەڵام هیچکات لە بەرامبەر عەقڵی ئەزموونی نەوەستایەوە، تەنیا هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کە زانستی ئەزموونی نوێ ڕیشەی لە نێو موسڵمانان دانەکوتا بوو. گەرچی ئافەتی لێ نەدی، بەڵام خێروبێرەکەشی بە نەسیب نەبوو. کاتێ ئەم زانستە سەرکەوتووە لە سەدەی نۆزدە و بیست خۆی گەیاندە وڵاتی موسڵمانان، نەک هەر نەبووە هۆی ترس لەبەرنانیان، بەڵکۆ خۆشحاڵیشی کردن لەوەی کە زانستی گاوربەزێن ئێستا هاتووە ببێتە دۆستی ئیسلام. روداوێکی سەیروسەمەرەیە کە زانست و فەلسەفەی نوێ لە وڵاتی موسڵمانان بەو

جۆرە دژایەتی ناکرێ. سەرەتا دەرگای زانکۆکانی بۆ والآ کرا و دواتر خۆی کرد بە ناو حوجرەی فەقێیاندا، کە بووە بابەتی دەرس خوێندنیان.

لە ئێرانی دوای شۆڕشی ئسلامیش بەم جۆرە بوو، لە یادمە دوای شۆڕش کە لە "ناوەندی شۆڕشی فەرهەنگ"یدا بووم، یەکێک لە ڕۆژنامەنووسانی ئیتالی چاوپێکەوتنێکی دەگەڵ کردم. لێی پرسیم ئایا قەول وایە مەوزووعی پەرەسەندنی داروین لە زانکۆکان وەلابنرێ؟ منیش بە نەخێر پەرسڤم دایەوە. دواتر لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە تاکو وێستا شتێکی لەمجۆرە بە بیری من و هاوڕێکانیشمدا نەهاتبوو. هەڵبەت حسابی مارکسیزم جیا بوو. مەلاکان هەمیشە ئەوان بە تیۆرییەکی ماکپەرەستی و دژە دینی دەزانن.

ئەمڕۆ لە ئێران بزوتنەوەیەک بە ناوی ڕۆشنبیرانی ئایینی سەریهەڵداوە کە دەیانهەوێ پێداچوونەوەیەکی نوێ بۆ تێگەیشتنەکانیان بۆ ئاوەز و وەحی بکەن. بە تایبەت لە بارەی قورئانەوە دەیانهەوێ وانەیەک لە ئەزموونی تەفسیرکردنەکانی ئایینی گاوریی وەربگرن. بە پێچەوانەی قسەکەی "بەندیکت"، ئەمان نەک هەر ئەوەی کە قورئان ئەدەنە دەس تەفسیری جیاواز و بەڵکو پێشیان وایە ئەم تەفسیرە جیاوازانە هیچ مونافاتێکیان لەگەل وەحیانی بوونی وتەکانی خودا نییە، هەروەها ئیسلام هەر لەم تەفسیرانەدا دەبیننەوە و پێشیان وایە کە گەیشتن بە گەوهەری نایابی دین کارێکی لە ڕادەبەدەر دژوار و بگرە مەحاڵە.

# ئەقڵ و ئەوین

نەریتی گرانبەها و پڕباری تەسەوفی ئیسلامی بەرهەمی دوو کاردانەوەیە: یەکەمیان لەبەرامبەر زێدەخوازی، خۆشگوزەرانی و عەیشو نوشی دەرباری سەرانی خەلافەتەکانی عەباسی و ئومەوی بووە، دووهەمیشیان لەبەرانبەر خودایەکی ترسناک و زۆردار و بەدەسەڵاتی ئەشعەرییەکان لە لایەک و وردبینی فەیلەسووفانی موعتەزییلە لەسەر وەسف و کارەکانی خودا، بە تایبەت دادی ئیلاهی لە لایەکی ترەوە. کاردانەوەی هەوەڵ تەسەوفی دنیانەویستی وەدیهێنا و کاردانەوەی دووهەمیش تەسەوفی ئەویندارانە.

تەسەوفی ئەویندارانە، ددانی نە بە عەقڵ دادەنا و نە بە ترسیش. دەیهەویست خودای خۆش بوێ نەک ئەوەی لێی بترسێ، تەسەوف دڵداری و ئەوینە، خولیایی پشتی پەردە بینینە. دەیهەویست بە سەرسوڕمانەوە لە خودا ڕامێنێ. نەک وەکوو فەیلەسووف خەریکی هەڵهێنانی مەتەڵی وجودی خودا بێ. مەنسوری حەلاج، سۆفی مەشهوری چەرخی سێی هجری، کاکڵەخۆشەی ئەم مەووزوعە بەم جۆرە بەیان دەکات: " دڵبەر گشت نازە نەک ڕاز" واتە ئەو وەرای فەیلەسووفان و عاقڵەکان نییە، بەڵکو تەنیا لایقی ئەویندارانە. بەم جۆرە بوو کە ئەوینداری هاتە جەنگی ئەقڵ، هەرچەندە لێرەدا لەوانەیە وشەی "جەنگ" زۆر بەجێ نەبێ، بەڵام بە گەڕان لە هەنبانەی سۆفییەکاندا، شتێکی کەمتر لە جەنگ دەست نادا.

عەشق هەم بووە رکابەری عەقڵی هزری و هەم عەقڵی کردەییش. لە لایەکەوە سوفییەکان دەیانگوت ئەوین چاوێک دەداتە ئەویندار و دەتوانێ بەو چاوەی شتگەلێک ببینێ کە عەقڵ لێی بێ بەشە. ئەوین چرایەکی روونە لە ناخی ئەویندارردا، کە دوورە لە هەر خشت و خاڵێک، گەیشتۆتە پایەیەکی بەرزتر. بە چاوی دڵ بۆ سەرچاوە دەڕوانێ. جەلالەدینی رومی گەورە شاعیری ئێرانی_ئەفغانی لە هەرای مامۆستای خۆشەویستی (شەمس) دەڵێ: " ئەی شەمسی تەبریزی، ئەوین تۆ دەناسێ نەک ئاوەز" واتە ئەوین بەرچاوان ڕوون دەکاتەوە، دەتوانێ ڕاستیەکان وەدۆزێت. لە لایەکی دیکەوە، بە بڕوای سۆفییەکان، عەقڵ مەخلوقێکی خۆپەرەست و خۆپارێزە و لە هەوڵی سوودی خۆیدایە و توانای لەخۆبوردوویی و چاکە و خۆبەشینی نییە. دەیانگوت ئەوین دەرمانی گشت دەردەکانی دڵە. مەولانا گوتەنی:

"شاد ببە ئەی ئەوینی خۆش سەودای ئێمە
ئەی دەوای گشــت دەردەکانـــــی ئێمە
ئەی دەرمـــــانی جیسم و ڕۆحی ئـــێمە
هەر تۆی ئەفلاتـــۆن و جالینوسی ئێمە"

گەرچی ئەم ئەوینداریيە گەوهەری نایابی دینە، بەڵام گەر ڕاستت دەوی لە سەرووی دینە. گشت دیندارێک لە دینداری لە دووی سوود و پاداشتە، هەرچەندە ئەمە لەخۆیدا خراپ نییە، بەڵام هیچکات ناگاتە مەرتەبەی ئەوینداری کە دەستی لە سوود و پاداشت هەڵگرتووە و دەستی داوەتە قوماری ئەویندارانە.

تەسەوفێک کە لەسەر پنجی ئەم ئەویندارییە بڕوێ، لەگەڵ وەحی پێکەوە پاڵدەدنەوە و کەم تا زۆر پێغەمبەرانیش بە عاریفانی گەورە دەبینن، کە ئەوان بەرهەمی وەحییەکەی خۆیان بۆ خەڵکی بەیان دەکرد، بەڵام ئێستا عاریفان کە پێغەمبەر نین، لەبۆیە بەرپرسیاریەتی لەوجۆرەیان نییە.

بەڵێ، پێوەندی نێوان تەسەوف و فەلسەفە یاخود ئەوین و ئاوەز، بە هەمان شێوەی ئەقڵ و وەحی هەمیشە پەیوەندییەکی هێمن و ئارام نەبووە. فەیلەسووفانی موسڵمان هەروەکوو چۆن سوودیان لە وەحی وەرگرتووە، سوودیان لە عیرفانیش بینیوە و هیچکامیشیان بە دژی عەقڵ نەزانیوە. فەیلەسووفان ئەوەندەیان سوود لە عیرفان وەرگرت کە ئاوەز پەسەندی دەکرد و ئەوەی تریان پشتگوێ دەخست، بەڵام عاریفان بیرێکی بێ فەلسەفەییان بەلاوە پەسەندتر بوو، پێیان وابوو بیری فەلسەفە و بەڵگاندن، ناسازگارە لەگەڵ "تێڕامان" (حیرت) کە شایستەی ئەویندارانە. لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ تێگەیشتنی عاریفەکان بە چەمکە فەلسەفییەکان پێوانە بکرێ، بەڵان بەم پێوەرە عیرفان، بێ دەعیەیی، ڕووسوریی و ڕەسەنایەتی خۆی لەدەست دەدا، هەر لەبەر هەندێ خۆ لە فەلسەفە بە دوور دەگرن.

من کە هەم فەلسەفەم گوتۆتەوە و هەم عیرفانیش، تەمەنێکم لەم مشتومڕانەدا بەسەر بردووە. بە چاکی لە قوتابییەکانم روانیوە کە لە کۆتاییدا کامیان هەڵدەبژێرن. کەمتر کەسێکم بینیوە خۆڕاگری هەبێ بەرامبەر چەقە و کێشەی هەردووکیان پێکەوە، هەمیشە زۆرینە ئەوینیان هەڵبژاردووە یان ئەقڵ، کە ئەوین بەهێزتر بووە.

# ئـەقڵ و شۆڕش

شۆڕش، تەقینەوەیەکی گەرمی هەستی بێزار بوونی مرۆڤە. ڕەهابوونی ئەو هەستەش وێرانکەرە و هیچ نزیکایەتیەکیشی لەگەڵ ئەقڵی ساردوسڕی توێژەرەوەیی نییە. بێزارییەک کە بە دوای لەناو بردنی داب و نەریت و دەسەڵات بێ، چ وێچوونێکی هەیە لەگەڵ ئەقڵێک کە لەدوای ناسین و زانین بێ؟ لە شۆڕشەکاندا، بەشی هەست و ئەوین بە چاکی بەجێ دێ، بەڵان ئەوە بەشی ئاوەزە کە لە بیر دەکرێ. زۆری پێدەچێ تا ڕێبەرانی شۆڕش ڕوو لە عەقڵانی بوون بکەن و دەست بە چاکسازی بکەن و بەر لە ماڵ وێرانییەکان بگرن.

پیاو دەبێ ئینسافی هەبێ، شۆڕش بە بێ عەقڵانی نابێ، بەڵام ئەم عەقڵانییە زیاتر لە ڕەتکردنەوەی عەقڵانی پێش خۆیەوە دەردەکەوێ. شۆڕشگێڕان زۆر چاک دەزانن کە چیان ناوێ، بەڵام تا تێ بگەن کە چییان دەوێ، ڕێگەیەکی دوور و درێژیان لەبەردەمە. شۆڕشگێڕانی ئامانج خواز لە خەملانی دەسەڵاتیان خەیاڵاوی دەبن، وا گومان دەبەن کە بە خێرایی دەتوانن نەریت و مرۆڤەکانی پێشتر بگۆڕن و نەریتو مرۆڤی نوێ لە جێگایان دابنێن. بە جۆرێک لە جۆرەکان شۆڕش، بێ سەروبەرییە واتە(ئانارشیزم)ە، و هەتا توخمی ئەم ئانارشیزمە لە کاردا نەبێ، شورشیش بوونی نابێ.

شەبەنگی ڕەنگاوڕەنگی راستی، لە شۆڕش هەموو رەنگەکانی لە دەست دەدا و تەنیا دەمێنێتەوە رەش و سپی: رابردوویەکی خراپ و داهاتوویەکی باش. دژە شۆڕشی خراپ و شۆڕشگێڕی باش... بەم جۆرە ڕێگە لە داوەری ئەقڵی توێژەری دەگیرێ و ناهێڵێ خەریکی دەرخستنی راستیەکان بێ.

لەشۆڕشدا تەنیا یەک پێوەر بۆ پێوانەی چاک و خراپ هەیە، ئەویش خودی شۆڕشە، وئەمەش خودی بێ پێوەرییە. نەک تەنیا شۆڕش باشە، بەڵکو لە بنەڕتدا باش، یەک شۆڕشە! کاتێک شتێک خۆی ببێتە پێوەر و تەرازوی خۆی، ئەوا سەرەتای بێ ئاوەزییە. کاری عاقڵان لە گۆڕەپانی شۆڕشدا، هەڵگێڕانەوەی شەپۆڵی شۆڕش نییە، چونکە توانایەکی لەوجۆرەیان نییە. کاری عاقڵان کەم کردنەوەی ماڵوێرانییەکانە و بەرەو باشتر بردنی کاروبارەکانە. من خۆم کە لە دڵی شورشێکدا ژیاوم وبەرپرسیاریەتیشم لە ئەستۆ بووە، بۆیە ئەم ڕاستیەم بە دڵ و گیان هەست پێکردووە.

کەسانێک کە شۆڕشیان بینیوە، چاک دەزانن ئەو کەسانە چەندە تاوانبارن کە هیچ رێگەیەکی تر جگە لە شۆڕشیان لە بەردەم خەڵک نەهێشتۆتەوە. هەوەڵین سامان کە لە شۆڕشدا دەکرێتە قوربانی، عەقڵانییەتە و دواهەمین شتیش کە دەگەڕێتەوە لانەی خۆی، هەر عەقڵانییەتە، ئەویش ئەگەر گەڕانەوەیک دەکاردا هەبێ.

لە ناو ئەم سێ رکابەرانە: وەحی، ئەوین و شۆڕش، ئەمەی ئاخریان لە هەمووان بێ رەحمتر و دژە ئاوەزترە. وەحی تا رادەیەک سەروکاری لەگەڵ ئەقڵدا پێکهێناوە کە دەتوانێ بە سوودی هەردوو لایان بێ. ئەوین هەمیشە کاڵایەکی دەگمەن بووە و شوێنکەوتوانێکی کەمی هەبووە، خەریکی داگیرسانی چرای ئەوینە و بەدوورە لە هەڵگیرسانی ئاگری فیتنە. لە شۆڕشە گشتگیرەکاندا، کە نە جوانییەکی ئەوین بەدیدەکرێ و نە پیرۆزی وەحییش، دەبێ تەنیا پەنا بۆ خودا ببردرێ، کە هەم گیانەکان دەستێنێ و هەم ئاوەزەکانیش. عاقڵان دەبێ دەرگا بۆ تەگبیری سیاسی، کۆمەڵایەتی

و ئابووریی بکەنەوە بۆ ئەوەی پێویست بە وێرانی و شۆڕشی دژە ئاوەز نەکات.

حافز دەڵێ:

ساقی بده جامی مەی به داد هەتا گەدا

با غیرەت پڕ نەکا جیهان و نەیدا بەفەنا

واتە دادپەروەری بەرفراوانتر بکەن تا پێویست بە شۆڕش نەکات.